# دەنگی منداڵان

از دیدگاه اهل تسنن



مەنسوور شەریفی

بسم الله الرحمن الرحيم


سر شناسه : شريفي ، منصور، ۱۳۳۹ -
عنوان و نام پديدآور : دەنگي مندالان / نووسەر و هونراوەي مەنسوور شەريفي .
مشخصات نشر : سنندج : تاڤگە، ۱۳۸۸.
مشخصات ظاهري : ۲۲ ص : مصور (رنگي) .
وضعيت فهرست نويسي : فيپا
يادداشت : گروه سني :ب
موضوع : شعر کردي
رده بندي ديويي : ۱۳۸۸ د۴۶۷ . ش ک ۹ فا ۸
شماره کتابشناسي ملي : ۱۸۲۲۳۸۶
شابک : ۰۷۸-۹۶٤-۸۷۰۹-٤٥-۲
گرافيست : شمس گراف ( بهزاد زندي )
تصوير گر : بهروز قادري

# شیعری دایە

ئەی لایە لایە  کۆرپەی شیرینم لایە

رەحمی پێکەی خودایە  کۆرپەم بۆ خەوی نایە

کۆرپەم بخەوە دێرە  خەو بۆ مێشکی تۆ خێرە

قەزات لە گیانم کەوێ  خەو لە چاوم ناسرەوێ

هەتا تۆ نەکەمە خەو  لێم حەرامە خواردن و خەو

رەونەقی ماڵم هەر تۆی  نەزرو و دۆعام کردووە بۆی

خوایە شوکر بۆ بەشت  بۆ بەشی جوان و گەشت

دۆعای خێرت بۆ ئەکەم  باش بخەوی کۆرپەکەم

باوکت تۆی زۆر خۆش ئەوێ  بە بێ تۆ شەو ناسرەوێ

# وڵامی منداڵ

دایە من ناچمە بێشکە
کەم بە ملما خوەت کێش کە

کاتێ بێشکەم ئەجوێنی
خەوم لێ ئەشێوێنی

دەس و پام ئەبەسیتەو
تا ئێوارە نامکەیتەو

شەویش هەتاکوو سەحەر
من لە بێشکە نایمە دەر

وەک زیندانی ئەسیرم
هەمیشە ماتڵ شیرم

هیچ نەماوە لە بیرم
وەک منداڵی فەقیرم

هەر لە ناو جێ بە عادی
وەکوو شلێر و شادی

یا وەک منداڵ ئابادی
حەز ئەکەمە ئازادی

کەمێ خۆەم راوەشێنم
یا تۆزێ خۆم بدوێنم

دایە لێمان نەتۆری
بە هیوام لێم ببووری

# قسەی دڵ مناڵ

دایە تۆ خوا مەدە لێم — شیعری کوردی بێژە پێم
لیباس کوردیم بۆ بسێنە — کتێب کوردیم بۆ بێنە
هەر بە کوردی ئەنووسم — تەک هەموو کەسێ دۆسم
من کوردی موسوڵمانم — پەیڕەو دین و قورئانم
عاشقی نیشتمانم — دایە قەزات لە گیانم
دایە مەرگت نەبینم — بە تۆ شیرینە ژینم
دایە ئیتر ناتۆرم — دەم و چاوم ئەشۆرم
گزگ ماڵیش ئەکێشم — ئەشغاڵەکەیش ئەڕێژم
کار و فەڕاشی ئەکەم — گشتی بە باشی ئەکەم
چایی ئەبەم بۆ مێمان — لە شار بێ یا لە دێمان
ئەچم میوە ئەسێنم — پێش‌دەسییەکان ئەهێنم
قڕو قاو ئاشپەزخانە — بۆ من قورس و گرانە
خۆت بیشۆرە دایە گیان — زەحمەت مەدە بە مێمان
یاخوا دایەم بۆ خۆش بێ — هەموو کات گوڵی گەش بێ

# ئامۆژگاری مامۆستا

کیژە جوانی موسولمان
یاخوا هەر خوەش بی بۆمان

یا خوا دوور بی لە وەرهەم
لە پەژارەو لە ماتەم

روو خۆش و میهرەبانی
ماشەڵڵا چەندە جوانی

ژیر و وریا و بەڕێزی
لای هەموو کەس عەزیزی

قورئان و دەرس بخوێنە
لە رەفیق جێ مەمێنە

هەر کەسێ جێ بمێنێ
شەیتان ئەیخەڵەتێنێ

شەیتان ئەیبا بە هەڵە
ئەیخاتە نێوی تەڵە

زینەتی خۆت داپۆشە
تا ئەتوانی تێکوشە

تێکوشین بۆ عیززەتە
عیززەت دژی زیلەتە

گوێ ڕاگرە بۆ دایە
مەچۆ کووچە بۆ کایە

عومرت مەدە بە زایە
دەرس بخوێنە بۆ پایە

عیلم و زانین دەرمانە
دەرمانی گشت دەردانە

من مامۆسای دلسۆزم
دلسۆزی گەل و هۆزم

# وڵامی مناڵ بو مامۆستا

ئەی مامۆسای بەڕێزم — قەد لە قسەت نابێزم
منیش هەر بە وێنەی تۆ — تۆم خۆش ئەوێ زۆر بە سۆ
دەرس و نەسیحەتی تۆ — قازانجی هەس بۆ گرۆ
رووسەری لە سەر سەرم — لیباس جوان کەمە بەرم
خۆم ئەپۆشم بە جوانی — ئەچم بو ئاو لە کانی
لیباسی تەنگ و بێ فەڕ — تا ماوم نایکەمە بەر
من کوردی با ویژدانم — چۆن ژیر و موسوڵمانم
لیباس خراپ ناپۆشم — دین و گەلم نافرۆشم
تا لەم دونیا بمێنم — عیلم و دەرسیش ئەخوێنم

# قسەو نەسیحەتی باوک

ئەی کیژی کرچ و کاڵم     یا خوا دوور بی لە زاڵم
من لە دووریت بێ حاڵم     سەر بنێرە سەر باڵم
بە هیوای مانگ و ساڵم     بویتە ئامەو بو مالم
رێزو حورمەتت بەرزە     دوور بی لە هەڵەو هەرزە
تاکوو های لە ئەم عەرزە     رێزی دایک و باب فەرزە
خوەش بەختیت عیلم و دەرزە     دەرمانی یاوو لەرزە
ئەی کیژی وریا و ژیرم     دایم هەر وای لە بیرم
تۆ مندالی، من پیرم     بە خۆشی تو من میرم
دەسمایەی قەومی ژیرم     بە هیوای رەوشەن بیرم
ئەی کیژی جوان و نازم     رەفیقی راز و نیازم
شیرین و دڵ نەوازم     من بە تۆوە ئەنازم
خوەش بەختیت بۆ ئەخوازم     لە خوای تەک و بێ نیازم

# نەسیحەتی خانم دوکتۆر

ئەی رۆڵەی وریاو جوانم — گوێ گرە بۆ قسەکانم
پاکی قازانجی زۆرە — دەس بە سابوون بشورە
باکوو نەخۆش نەکەوی — بە بێ میسواک نەخەوی
میسواک بدە لە دیانت — بۆ سڵامەتی ژیانت
قەن خراوە بۆ ژیانت — ئەڕزێنێ دیانەکانت
شت سەختی پێ مەشکێنە — زۆر خۆتی پێ مەنوێنە
دەرزی و دەرمان پێویستە — ئەویش وەک نمرەی بیستە
لیباس گەرم کە بەرت — کڵاوی نەرم کە سەرت
باکوو ناخۆش نەکەوی — موحتاج بە دوکتۆر نەوی

# شیعری قورئان

قورئانم پێشوایە — بۆ هەر دەردێ دەوایە
دژی نەفس و هەوایە — لە بۆ غەنی و گەدایە
لە ناو قەبرا چرایە — بۆ قیامەت برایە
قورئان نوورو رەحمەتە — هەمووی پەندو حیکمەتە
بۆ ئیماندار عیززەتە — بۆ تاوانبار رەحمەتە
قورئان شەفیعە بۆمان — پەند و ئەندەرزە بۆمان
دایەی عەزیز و نازم — موعەلیمی هاوڕازم
قورئانەکەم پێ بێژە — بیر و هۆشم زور تێژە
بە یارمەتی زاتی حەق — لەم کارە بووم موەفەق
تەواو قورئان کەم رەوان — بیکەمە ویردی زوان
هەتا لە دونیا ماوم — پێلاّت ئەنمە سەر چاوم

# شیعری باوک بۆکوڕ

ڕۆڵە کوڕم گوێ بگرە
کاتێ دیتەوە بۆ ماڵ
لیباست ئاوێزان کە
دەرسەکانت دەور کەرەو
قورئان و دەرس بخوێنە
لە کەلاس نەزمت هەبێ
کوڕم زیرەک و ژیر بە
لە ناو خیابان رانەکەی
کوڕم یاخوا ناودار بی

ئیتر بەهانە مەگرە
مەیکە هەراو گرم و قاڵ
ناو ماڵەکە میزان کە
نمرەکانت بوە سەرەو
نمرەی بیستم بۆ بێنە
موعەلیم لێت زیز نەبێ
خاوێن و رۆشنبیر بە
کیف و پوولت گوم نەکەی
بادین و با ویقار بی

## لە شیعرەکانی مامۆستا عالی

## باسی نوێژو قورئان و پاک و خاوێنی

خوداوەند نیعمەت ئەدات ... ئینسان عیبادەت ئەکات
هەڵسە رۆڵەی بائیمان ... دەخیلە زووکە، ئامان!
نوێژو دەرس و عیبادەت ... ئەنجام دە لەل ئیتاعەت
فرمان کەری شیرینی ... نوێژ خوێنی نوورینی
هەڵسە دەس نوێژێ بگرە ... لیباسی تەقوا ببڕە
خۆت کە بە رەفیق مەلەک ... پەرواز بکە بو فەلەک
دایک و باوکت رازی کە ... وەرزش و هەم بازی کە
پاک و خاوێن و ژیر بە ... ئازا و روشن زەمیر بە
دەرس خوێن و ئاگادار بە ... لە ناو خەڵکا هووشیار بە
قورئان بخوێنە بە دڵ ... خۆت بۆ خۆش کە وەکوو گوڵ
زوو کە رۆڵەی شیرینم ... یاخوا مەرگت نەبینم

شوکری زاتی یەزدان کـە
نوێژ لە بـۆ دیـن ستوونە
سوپاس و شوکری خوایە
حەیفە لە خوا غـافڵ بـین
بـا یادی ئـەو لە دڵ بـێ
مزگەوت چاوەڕوان تـۆیە
قـــورئان ڕێـــنومامانە
یـاخوا ژیـنت پیرۆز بـێ
بـێزار بـین لەو بـێگانە
لابـەین جیاوازی و کـینە
تـەقوا بکـەین بـە پـیشە
ئـیسلام ڕێبازێ جـوانـە

ڕوو لە ڕێگەی مەردان کە
عیبادەت خوای بێ چوونە
بـڕوا بکـەن هـەر وایە
سـتەمکار و جـاهل بـین
ژیـانتان پڕ لە گـوڵ بـێ
دڵت بـۆ ئـەو بە سۆیە
بـەڵگەی دیـن و ئـەمانە
دڵت گەرم و بە سۆز بـێ
مـاڵمان ئـەکـا وێرانـە
بگرین ڕێگەی ئەم دینـە
خراپـی لابـەین لە ریشـە
بۆ گەل بە وێنەی شـوانـە

## لە شیعرەکانی مامۆستا عالی پیرۆزبایی نەورۆز
## لەگەنجان و لاوان

نــــەورۆزتان لێ پــیرۆز بـــێ
دڵـتان بـۆ گـەل بـە سـۆز بـێ

یــاخوا مــوبارەک بـــێ ساڵ
چاک و پاک بـێ ماڵ و حـاڵ

دەی بــا ژیــر و عــاقڵ بین
راست و ســادە و عـادڵ بـین

خۆمان پوخت و خاوێن کەین
خواناس و پاک داوێن کـەین

رێــز بگــرین لەگــژ و گــیا
ئـــاو و دیـــمەن و چـــیا

لەگـــەورە و لە دڵســـوزان
لە قـەوم و خـویش و هـۆزان

لە مـــامۆستا و خـــوێندکاران
لە گـــوڵ لە مـــەل لە داران

یــا خـوا ژیـنت رەنگین بێ
عەقڵ و حەیات سـەنگین بـێ

هـــەوڵیک بــدە بــۆ زانــین
لە بـــواری عــیشق و ئــایین

بـــۆ ســـەرکەوتن نــیشتمان
بـــۆ ئـــارامش بـــۆ ئـــەمان

قـــەت لە خـــەما نـــەتبینم
یـــاری ژیـــر و شـــیرینم

عـــالی چـــاوەڕوان تـــۆیە
بـــۆیە دڵــەکـەی بــە سـۆیە

